تصوير ابو عبد الرحمن الكردي

نەوزاد عەلی ئەحمەد

# گۆڤاری گزنگ

## لێکۆڵینەوەو بیبلیۆگرافیا

منتدى إقرأ الثقافي
للكتب ( كوردي - عربي - فارسي )
www.iqra.ahlamontada.com

# گۆڤاری گزنگ

## لێکۆڵینەوەو بیبلیۆگرافیا


موسسه چاپ و انتشارات رهرو

ناوەندی بلاوکردنەوەی

فەرهەنگ و ئەدەبیاتی کوردی

۰۴۴۲۱ - ۲۵۵۲

مدیر مسئول لقمان رهرو



**نەوزاد عەلی ئەحمەد**





**سلێمانی - ١٩٩٩**

- گۆڤاری گزنگ (لێکۆڵینەوەو بیبلۆگرافیا)
- نەوزاد عەلی ئەحمەد
- چاپی یەکەم
- سلێمانی ١٩٩٩
- تیراژ: (٣٠٠) دانە
- ژمارەی سپاردنی ٤٢٣ ساڵی ١٩٩٩ی پێدراوە
- کۆمپیوتەرو چاپی دەزگای سەردەم




لە چاپکراوەکانی دەزگای چاپو پەخشی سەردەم زنجیرە (٤٨)

# پێشەکی

ئەم لێکۆڵینەوەیە، کە هەڵگری سەرناوی "گۆڤاری گزنگ، ١٩٧٢-١٩٩١. لێکۆڵینەوەو بیبلیۆگرافیا" باسێکە تائێستا تەنیا لەدوو وتاری کورت بترازێ هیچی لەسەر نەنووسراوە ئەو دوو وتارەش یەکێکیان هەر خۆم نووسیومە و وەکو هەر بڵاوکراوەیەکی شۆڕشی نوێ لەگۆشەی "ئەدەبیاتی شۆڕشی نوێمان" لەرۆژنامەی کوردستانی نوێ هەڵوەستەمەی بۆ کردو بەچەند دێرێکی کورت کاتی لێی دواوم و دوایش لەهەمان رۆژنامەدا برای نووسەر ئەحمەد عارف لەوتارێکدا ئیزافەیەکی تری خستە سەر وتارەکەم، بەڵام دیاربوو وەکو گەیشتنە قەناعەتێك هەستم کرد کە مێژووی ئەم گۆڤارەو دەرکردنەوەی ژمارەکانی کارێکە ئەوە هەڵدەگرێ زیاترو باشتری لەسەر بنووسرێت، بۆیە دەستم بەو کارەکردو ئەم لێکۆڵینەوەیەی لێکەوتەوە جا لە پێناوی زانستیەتی باسەکە دابەشی سێ بەشم کردووە لەبەشی یەکەمدا لە "کەرکوك، مێژوویی سیاسی، رۆشنبیری، رۆژنامەگەری" دواوم، لەبەشی دووەمدا لە "گۆڤاری

گزنگ، هەرسێ قۆناغەکەی" بۆتە تەواوکەری بەشی یەکەم و ئەڵقەی بەیەك گەیشتنی بەشی سێیەمیش، لەبەشی سێیەمدا لە پێناوی روونتر خوێندنەوەی ناوەڕۆکی گۆڤارەکەو تابزانرێت چی بڵاوکردۆتەوە "بیبلیۆگرافیای گۆڤارەکە"م خستۆتە ڕوو و بەشێوەیەکی زانستیانەو سەردەمانە بیبلیۆگرافیام بۆ بابەت و ناوەکان کردووە، ئەو بەشەش بۆیەرێك خراوە چونکە زۆربەی ژمارەکانی گۆڤارەکە فەوتاون، هۆیەکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە وەکو لەکێرڤی مێژوویی ناوەڕۆکی باسەکەدا دەردەکەوێت دەرچوون و بەردەوامی گۆڤارەکە لەگەڵ مێژووی بزووتنەوەی رزگاریخوازانەی گەلەکەمان لەگۆڕاندا بووە.

رەنگە خوێنەری بەڕێز پرسیارێك رووبەڕووم بکاتەوە بۆئەم بابەت هەڵبژاردووە؟ پێش هەموو شتێك هەڵبژاردنی ئەم بابەتە پەیوەندی بەو بەرنامەو پرۆژەیە هەیە کەهەر لەرۆژانی راپەریندا خەریکی بەدوادا چوون و لێکۆڵینەوەم سەبارەت بە ئەدەبیاتی شۆڕش بەگشتی و شۆڕشی نوێی گەلەکەمان* بەتایبەتی، ئەمەو بێجگە لەنەبوونی پسپۆرو بۆ شاییەکی گەورە لەم بوارەدا ئەمانەو بوونی ئارەزووی شەخسیش وایان لێکردم کە سێ مانگ خۆم بەم باسە خەریك بکەم و تا ئەو لێکۆڵینەوەیەی لێکەوتەوە.

لێکۆڵینەوەکە بۆ میتۆدی نووسین و پێداچوونەوەدا بەشێوەیەکی پراکتیکی لەرووی دەرەوەی گۆڤارەکە دواوە کە

لەنووسیندا دەچێتە خانەی فۆرمەوە بەهیوام توانیبێتم کارێکم بەئەنجام گەیاندبێ، کە بۆ گۆڤارەکە بەگشتیو بۆ مێژووی ئەدەبیاتی کوردی خزمەتێکی بەرچاوی کردبێت.

* *لەو بوارەدا چەند کارم بەئەنجام گەیاندووە:*

ا- چاپکردنی کتێبی، بەرەوسەرتا، حەوت لێکۆڵینەوەیە سەبارەت بە باری رۆژنامەگەری لەشاخدا، سلێمانی-١٩٩٨.

ب- بیبلیۆگرافیای هەردوو گۆڤاری نووسەری کورد و نووسەری کوردستان، بەهاوکاری کاك یاسین قادر بەرزنجی سلێمانی- ١٩٩٨.

ج- گۆشەی "ئەدەبیاتی شۆڕشی نوێمان" (١٢١) ئەڵقەم لەکوردستانی نوێ بڵاوکردۆتەوە.

## کەرکوك
## باری مێژوویی ـ سیاسیی،
## ڕۆشنبیریی،
## ڕۆژنامەنووسیی

### ١-١ باری مێژوویی- سیاسیی

یەکێك لەو پرسیارانەی کە دەمێکە فرچکی پێوە کراوە و لە گەلێك بۆنەو کاتدا دووبارەی دەکەینەوە و دووبارە دەکرێتەوە، کەرکوك و کێشەی کەرکوکە، تا ئێستا بەهۆی ناوچەی ستراتیژیەتی کەرکوکەوە،زۆرغەدر لەو شارە کراوەو جوگرافیاکەی شێوێندراوە بەتایبەتی بۆ کوردێنی ئەو شارە!بەلاّم هۆکاری هەرەسەرەکی بۆ ئەو شەڕانەی لەسەری کراون بەرجەستە بوونیەتی بەسەرتاپای ستراتیژیەتی کوردستان چونکە(کوردستان کۆڵەکەی ڕۆژهەلاّتی ناوەڕاستەو بێجگە لەگرنگیە ستراتیژیەکەی،خاوەنی سامانێکی کانزایی و نەوتێکی زۆریشی تیایە)[1] ئەمە ئەو پرسیارەیە، کە هەردەم

[1] الطالباني، جلال، كردستان والحركة القومية الكردية، منشورات النور، الطبعة الاولى- بغداد، ١٩٧٠ ص١٤.

لە کۆلۆنیەتی کوردستان دەکرێت،بە تایبەتی بوونی نەوتێکی زۆر لەناوچەکەدا،بۆوەلآمی پرسیاری کوردێتی‌کەرکوک یەکێك لەو بۆچوونانە دەنووسمەوە،کەلە قاموسی ئیعلامی عوسمانی‌دا هاتووە ودەلێت :(سنووری سروشتی دوو نەتەوەی جیاواز لەیەك جیا دەکەنەوە).[2] شایەنی باسە ئەم قاموسە ساڵی (١٨٩٠) لەئەستەنبول چاپکراوە و قاموسێکە جێگای بڕوایە و وەکو سەرچاوەیەکی موعتەبەرحیسابی بۆدەکرێت.

بۆ مێژووی کەرکوك، وەکو شارێکی مێژوویی، زۆربەی سەرچاوەکان ئاوە دانکردنەوەی شارەکە بۆ مێژوویەکی دووری پێش زاین دەگەرێننەوە ولە هەندێك سەرچاوەدا هاتووە کە لەشاری هەولێریش کۆنترە[3]، بەلآم ئەوەی لە پێش هەموو شتەکان کەرکوك بە قەلآو نەوتەکەی ناسراوە، دیارە لەبەرئەوەی وەك مەسەلەیەکی سیاسی سەیری نەوتەکە کراوە کێشەی نێوان کورد و دەسەلآتدارێتی ناوەندی گەورەکردوەو پێش ئەوەی باس لەو ململانێ‌یە بکەین پێویستە بزانین، کە (ساڵی ٥٧٠ پ.ز نەوت لەکەرکوك دۆزراوەتەوە و لەشێوەی ئەفسانە باسی لێوەکراوە و، پاش ماوەیەکی دوورو درێژ ئینجا شارەزایانی

---

[2] ستران عبدالله، رازەکانی تەعریب و راگواستن، سلێمانی ١٩٩٩، ل١٤٧.

[3] بۆ زانیاری زیاتر سەیری ئەم دوو سەرچاوەە بکە:

ا- زەکی، محمد امین، کوردو کوردستان، چاپخانەی دار السلام بەغدا، ١٩٣١.

ب- الجاف، وریا، کرکوك، دراسة سیاسیة واجتماعیة، اربیل، ١٩٩٨.

ج- ئەمنی ستراتیجی عێراق و سێکوچکەی بەعسیان (تەرحیل، تەعریب، تەبعیس) ئەمین قادر مینە، چاپی دووەم، سلێمانی ١٩٩٩.

نـەوت لەگـەڵ دەوڵـەتی عوسمـانیی پـەیمانێکیان مۆرکـردوە، ئـەم پەیمانـەش بـۆ حکومـەتی عـێراق گەڕاوەتـەوە)[٤] پرسـیارێکی تـر، کـە بۆتەگرێی نێوان دەسەڵات وکورد بەتایبەتی لەکاتی گفتوگۆدا ئەویش وەکـو وتمـان کوردێنـی کەرکوکـە، بۆئـەم مەسـە لەیـە جـارێکیتر دەگەڕێینـەوە سـەر سـەرچاوەیەك کەئـەویش قاموسـی ئیعلامـە ئـەو سـەرچاوەیە دەنووسـێت ( شەمسـەدین سـامی زانـای بـە ناویـانگ و مێژوونوسی تورکیش لە کتێبی "قاموس ئەعلام" کەلە ساڵی-١٨٩٠- لە ئەسـتەمبوڵ چـاپکراوە، لـەبارەی کـەرکوك دەڵێـت (شـاری کـەرکوك مەرکەزی ئەو لیوایەیە کەپێی ئەڵێن شارەزوور و ئەکەوێتە ویلایـەتی موسڵ لەکوردستان دا سێ‌چارەکی دانیشتوانی کوردن و چارەکەکەی تریـان تـورك وعـەرەب و شتی‌ترن)[٥] وەکو لەپێشـەوە ئیشـارەتی پێـدرا کەبونی نەوت، پلەی یەکەم و شوێنی ستراتیژی کەرکوك بەپلەی دووەم گرێـی گفتوگـۆی مێزەکـانی مناقەشـەی گـەرمکردووە و ئەمـەو لـە خـەباتی چەکدارانـەی گەلەکـەماندا، کەسـاڵانێکە کـورد لـە پێنـاوی ڕزگاری نیشتمانیدا دەستی داوەتێ، لە پێش هەموو دۆزەکان کەرکوك دێت، بۆیـە زۆر ئاساییە نووسەرێکی عـەرەبی وەکو هـلال ناجی بڵێـت (نـەوتی کـەرکوك لـە کوردسـتان دا بـوو بـەهۆی ئـەوەی کـە هـەندێ لـە قەومی‌یـە عەرەبـەکان دان بـە مـافی نەتەوایـەتی کـورددا نـەنێن، بـەڵام پێویستە ئەم جۆرە بۆ چوونە تەرە بکرێت. چونکە گەلی عەرەب خاوەنی

---

[٤] هاواری کەرکوك (گۆڤار)، ژمارە (٢)، کانوونی یەکەم ١٩٩٨ ل٣٧.

[٥] کەرکوك و سیاسەتی تەعریب، لەبڵاوکراوەکانی دەزگای ڕاگەیاندن، یەکێتی‌ی نیشتمانی‌ی کوردستان، ئازاری ١٩٨٥ ل١٥.

سامانێکی زۆری نەوتە)[٦] ئەمەو مێژووی کەرکوك بۆ کورد بریتی‌یە لە ڕۆژگارە سەختەکان و هەموو حکومەتە یەك لە دوای یەکەکان حیسابێکی تریان بۆ کەرکوك کردووە، کە لەپێش هەموو حیساباتەکان چۆڵکردنی ئەوشارەیە لەکورد، بەتایبەتی ڕژێمی ئێستا، کەهەر لەسەرەتای دامەزراندنیەوە بەبەرنامەیەکی ڕەگەزپەرستانە کەوتە مامەڵەکردن لەگەڵبوونی نەتەوەی کورد لەم شارەدا، بۆیە بۆئەم تێزە باشترە جارێکی تر نامیلکەی(اهداف وغایات)بخوێندرێتەوەکە بەعسیەکان لەساڵی ١٩٤٥دا نوسیویانەو بریتیە لە ڕاسپاردەو بەرنامەکانیانە کەهەڵێنجاوی کۆنگرەی یەکەمینیان سەبارەت بە کەمینەکان و کێشەکانیان کەتیایە بە بەرنامەیەکی ترسناك سەرەتایان گرتووە جائەگەر لەم ڕوانگەیەوە سەیری مێژووی حزبی بەعس لە عێراقدا بکەین کەچی بەرامبەر بەو شارەکردووە؟ ئەوە هەمووی بریتی‌یە لە پیلان و لەناوبردن و ئەنفال و چۆڵکردنی ئەو شارە لەکورد بۆنموونە لەساڵی ١٩٦٣ کە تەنیا بۆماوەی شەش مانگ لەعێراق دەسەلاتی وەرگرت(بەبیانوی پاراستنی ئەمنی شاری کەرکوك و ناوچە نەوتاوییەکان، کەوتنە ڕوخاندنی هە اران خانووی کوردی گەڕەکەکانی شۆریجە و ئازادی لە کەرکوك دا، هەروەها(٢١گوندیان لەنێوان ناوچەی دبس و کەرکوك ڕاگواست و زیاتر لە(١٥٠٠خێزانی جوتیاری گوندەکانی مامەو، عەلی غیر، شیرناو، قەرەدەرە،عەمشە، قوتان، قەرەهەیبەت،جوان، قوشقایەوکتکە وشانەشێن و مەلای عەبدوڵاو چەندین دێهاتی تریان دەربەدەر کرد و عەشایەری عەرەبیان لەشوێن دا

---

[٦] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٦.

نیشتەجیٚکردن)[٧] ئەم سیاسەتە دوای هاتنەوەی جارێکی تری بەعسیەکان و چوونەسەر تەختی دەسەڵاتداریتی لەساڵی ١٩٦٨ڕەگەز پەرستانە تروشۆفێنیانەتر کەوتنە بە عەرەبکردنی کەرکوك چونکە دەیانزانی خاڵی حەسمی نێوان خۆیان وبزوتنەوەی ڕزگاریخوازانەی گەلی کوردە، بۆ نمونە لە هەموو گفتوگۆکانی نێوان کورد و دەسەڵاتی مەرکەزیدا لە (١٩٦٢،١٩٦٣، ١٩٦٤، ١٩٦٦، ١٩٧٠، ١٩٧٩، ١٩٨٤، ١٩٩١،)[٨] خاڵی چەقینی گفتوگۆکان شاری کەرکوك بووە، بۆ نموونە بەعسیەکان ئەوەندە لە کەرکوك ترساون لە گفتوگۆی (١٩٧٠-١٩٧٤)یشدا هەرخەریکی تەعریبکردنی کەرکوك بوونە، بۆ نموونە لەدوای بەیاننامەی ١١ی ئازاری ساڵی ١٩٧٠ شدا، لەبری ئەوەی بەندی ١٤ی بەیاننامەکە لەسەر سەرژمێری گشتی جیٚبەجیٚ بکەن کەوتنە نەقڵ کردنی هەموو فەرمانبەرە کوردو تورکەکانی دائیرەی سجلی مەدەنی کەرکوك و فەرمانبەری بەعسی عەرەبیان هێنایە شوێنیان)[٩] هەر ئەو چەوسانەوەیە بوو، کە لە ڕاپەڕینەکانی بەهاری ١٩٩١ دا کورد و بزوتنەوە سیاسیە چەکدارەکەی هەوڵیداو بەرنامەی داڕشت کە هەرچۆنێك بێت پێویستە کەرکوکیش بچێتە سەر ناوچە ئازاد کراوەکانی کوردستان ئیتر ئەوە بوو لە بیست و یەکی ئازاردا کەرکوکیش ئازاد کراو هاتەوە باوەشی کوردستان و کوردێنی خۆی سەلماندەوە...

---

[٧] هەمان سەرچاوە، ل١٨.

[٨] باسکار (گۆڤار)، ژمارە (١) لەندەن، هاوینی ١٩٩٨، ل١٣.

[٩] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٩.

ئەم چەند دێڕەی پێشەوە کورتەیەکی زۆر چڕ بوو سەبارەت بە کەرکوك و مێژووەکەی و خاڵە ستراتیژییەکانیو ئەو ناکۆکیانەی تائێستا لەسەری گەرمە.

### ١-٢ باری ڕۆشنبیریی

سەرەرای ئەم سیاسەتە نادروست و توندانەی دەرهەق بەو شارە کراوە و دەکرێت، بەڵام هەر هەوڵە ڕۆشنبیری و کلتورییەکان هەوڵیان داوە کپ نەبن و بە هەر شێوەیەك بێت سەروەری بۆ شارەکەو کورد تۆمار بکەن، ئەم شارەش وەکو هەموو شارەکانی تری کوردستان، سەرەتای خوێندن و ڕۆشنبیری و نووسین و نووسین کاری لە مزگەوت و حوجرە سەری هەڵداو پانتاییەکی تری بەخشیە شارەکە، ئەو سەرەتایە یەگشتی لەهەموو شوێنەکاندا، باش بۆ ئەدەبیاتو کلتوری کوردی کەوتەوە بۆ کەرکوك بەهەمان جۆر دەروازەیەکە زۆر لە نووسەر و شاعیری پێگەیاندن، کە لەهەموویان دیار تر شێخ ڕەزای تاڵەبانییە، ئەمەو بێجگە لە تەکیەو خانەقاکانی کەرکوك کە زۆر بەناوبانگن لە کوردستان وەك تەکیەکانی، تاڵەبانی، حاجی حەیدەر، شێخ عەبدوڵڵە شۆرجەو ئەمەو بێجگە لە خانەقاکانی، شێخ ئەحمەدی خانەقاو خادم سوجادە، هەروەها بوونی چەندان خوێندنگەی ئاینیش لەو شارەدا ڕوویەکی تری دابووە باری ڕۆشنبیری، کەئەویش وەکو شارەکانی تری کوردستان بە مەرکەزێکی دیار حیسابی بۆ کراوە، بۆ خوێندن و خوێندەواریو پلەی فەقێیەتی و مەلایەتی خەڵك ڕووی تێکردووە، هەروەها هەر لە کۆنەوە لەم شارەدا گرنگی بەچاپ و چاپخانەو

چاپگەری دراوە هەندێك لەو چاپخانانە تائێستا شتێکیان لە دوا بەجێماوە یاخود شوێنەوارەکەیان کوێر نەبۆتەوە، یاخود تائێستا کاردەکەن و بەرهەم دەدەن و چالاکی دەنوێنن، بەڵام دیارە لە بەرنامەی عوسمانیەکاندا ئەو ویلایەتەش بێبەش نەبووە لەکارو چالاکیە رۆشنبیریو پەروەردەییەکاندا، کە ڕاستە بۆ بەرێوەچوونی سیاسەتی خۆیان ئەو کارانەیان کردووە، بەڵام لەئەنجامدا نەتەوە ژێر دەستەکانیش توانیویانە سوود لەو کارانە وەربگرن، بۆ نموونە(عوسمانیەکان هەرزوو چاپخانەیەکیان لە شاری کەرکوك بەناوی((صنائع مکتبی مطبعه سی))دامەزراندبوو..)[10]

یەکێك لەو خاسیەتانە کە چاپخانە هەیەتی بەرجەستەبووی چالاکی خوێندەواری و ڕۆشنبیریە، جا بڵاوبوونەوەی چاپخانەش زیاتر ئەو ڕەوتە بەرەو پێشەوە دەبات، کەرکوکیش لەو بوارەدا ڕوویێکی دیاری بۆ خۆی تۆمار کردووە لەو چاپخانەوکە لەکەرکوك دا دامەزراون بریتین لە:[11]

١- چاپخانەی الولایة: ساڵی ١٢٩٦ ڕۆمی لەسەردەمی فەیزی پاشادا دامەزراوە.

---

[10] جاف، وریا، کاروانی ڕۆژنامەگەری کوردی، هەولێر، ١٩٩٩ ل٧.

[11] بۆ ئەم زانیارانە زیاتر سوود لەم سەرچاوانە بینراوە

ا- الجاف، وریا، کەرکوك ل٤١.

ب- الجباري، جبار محمد، تاريخ الصحافة الكردية في العراق ص٩٠.

ج- هاواری کەرکوك (گۆڤار) ژمارە (٢) ل٤٣.

٢- چاپخانەی الصنائع: لەسەردەمی سوڵتان عبدالحمید لەناو قوتابخانەی (الصنائع السلطانیه) دامەزراوە.

٣- چاپخانەی البلدیة: چاپخانەیەکی کۆنە لەساڵی ١٩٢٦ دامەزراوە دوای شۆڕشی چواردەی تەمموز ئامێری تری بۆ زیاد کراوەو یەکێك لە ئامێرەکان ڕۆژنامەی(کەرکوك)ی پێ چاپکراوە.

٤- چاپخانەی الحوادث: ساڵی ١٩١١ دامەزراوە. ڕۆژنامەی( النجمە)ی پێ چاپکراوە.

٥- چاپخانەی نینوی: ساڵی ١٩٥٣ دامەزراوە، چاپکراوی کلدانی چاپ کردووە

٦- چاپخانەی التشویج: ئەم چاپخانەیە ١٩٥٣ دامەزراوە و دوای شۆڕشی چواردەی تەمموزی ١٩٥٨ ناوەکەی کراوە بە کەرکوك.

٧- چاپخانەی الترقی: ساڵی ١٩٥٣ دامەزراوە، دوایی ناوەکەی کراوە بە(بشیر) کۆمەڵێ کتێب و حیکایەتی کوردی پێ‌چاپکراوە، ئەمەو بێجگە لە چاپکردنی ڕۆژنامەو گۆڤار.

٨- چاپخانەی هیلال ساڵی ١٩٥٥ دامەزراوە، چەندان چاپکراوی بە کوردی و عەرەبی و تورکمانی و ئینگلیزی چاپکردووە.

٩- چاپخانەی الشمال: بەگوێرەی ئەوسا، چاپخانەیەکی نوێ بوو ساڵی ١٩٥٦ دامەزراوە و چەندان چاپکراوی بە کوردی و عەرەبی و تورکمانی و ئینگلیزی چاپکردووە.

١٠- چاپخانەی الجمهوریة: ساڵی ١٩٦٨ دامەزراوە و چەندان کتێب و گۆڤاری چاپ کردووە، کە هەندێکیان بە زمانی کوردی بوون.

١١- چاپخانەی الحکمة: لەبەر ئەوەی ئامێرەکان زۆر کۆن بوون، تەنیا ئیعلانات و چەند کارێکی سادەو بچووکی پێکراوە.

١٢- چاپخانەی التجارة: ساڵی ١٩٧١ دامەزراوەو ئامێرەکانی ئەڵمانین، چەندان کتێب و بڵاوکراوەی بە کوردی پێ چاپکراوە.

بەڵام سەردەمی هەرە زێڕین و دیاری ڕۆشنبیری کوردی لە کەرکوکدا دوای بەیانی یانزەی ئازاری ١٩٧٠ دەست پێدەکات کە جوڵانەوەیەکی دیاری بەخۆوە بینی، لە سەرووی هەموویانەوە بە چاو قایمی ئەدیبان لقی کەرکوکی یەکێتی نووسەرانی کورد لەو شارەدا کرایەوە، ئەمەو بێجگە لە کۆمەڵەی ڕۆشنبیری کوردی و کۆمەڵەی هونەر و وێژەی کوردی و ڕێکخراوە جەماوەرییە حزبیەکانیش ڕۆڵی دیاریان بینی لە ڕەگ داکوتانی ڕۆشنبیری لەو شارەدا، هەروەها چەندان تیپی هونەری مۆسیقاو شانۆگەریشی تیایە دامەزرا، یەکێك لەو چالاکیە دیارانەی کە لە کەرکوك دەکران و تائێستاش وەکو سەروەرییەك باسی دەکرێت ئەویش میهرەجانی یەکەمی شیعری کوردییە لەژێر دروشمی((سیعرو نەورۆزو ئازار) کەلە (١٩٧٢/٣/٢٢)چالاکیەکانی بەڕێوە چوو.

هەر لەم ماوەیەدا دەیان کۆڕی ئەدەبی و هونەری پێشکەشکران و چەند تەمسیلی و شانۆ گەرییەکیش پێشکەشکران، کە تائێستاکە باس دەکرێن وەك تەمسیلیەکانی ((بەهاری دزراو، مەرەزە)) ئەمەو بێجگە لە کردنەوەی چەندان پێشانگای شێوەکاری

ئەو خاڵ و خاسیەت و خاڵبەندییانەی پێشەوە، دەبنە کۆمەڵێ وەڵام بۆ پرسیارەکانی دوایی، کە لەمەڕ  باری ڕۆژنامەنووسی کوردی لە کەرکوك دێنە کردن،  یاخود دەستە واژەی ئاساییێ بۆ پڕکردنەوەی ئەو واتایەن، کە ئایا کەرکوك لەو فەزای ڕۆشنبیریدا چی کردووە و کامە گۆشەی گرتووە.

### ۱-۳ باری ڕۆژنامە نووسیی

لە خاڵەکەی پێشەوەدا،لەبوونی چاپخانە لە شاری کەرکوك، دواین و لە هەندێك حاڵەتیش دواین. کە ئەو چاپخانانە ماوەماوە ڕۆژنامەو گۆڤار و بڵاوکراوەیان پێ چاپ کراوە، بەڵێ بۆ ئەوەی سەرەتایەکی باشتر بۆ بابەتەکەمان دابڕێژین. پێویستە لە ڕەوتی ڕۆژنامەگەری کوردی لەو شارەدا بدوێین، کە ئەو گۆڤارو ڕۆژنامە مێژووی سەروەریەکن بۆ شارەکە:

۱-ڕۆژنامەی کەرکوك: ڕۆژنامەیەکی هەواڵ بووە، هەفتانە دەرچووە، شارەوانی کەرکوك لە ۱۵ی تشرینی دووەمی ۱۹۲٦ بەسێ زمان؛ عەرەبی، کوردی، تورکی دەریکردووە، لەسەرەتادا تەنیا بەزمانی تورکی دەرچووە، لە ساڵی پێنجەمەوە(۱۹۳۰)دا زمانی کوردیشی بۆ زیاد کراوە،  بەڵام لە ساڵی شەشەمدا بەبێ ئەوەی هۆیەکەی بزانرێت کوردیەکەی ئیلغا کراوەتەوە.[۱۲]

---

[۱۲] تاريخ الصحافة الكردية، ص۳۷.

٢-گۆڤاری شەفەق: گۆڤارێکی ئەدەبی، ڕۆشنبیری، کۆمەڵایەتی، نیو مانگی بووە، بە زمانی کوردی و عەرەبی دەرچووە، یەکەم ژمارەی لە ١٥ی کانونی دووەمی ١٩٥٨ دەرچووە، خاوەنەکەی پلەدارێکی خانەنشین بووە بە ناوی عەبدولقادر بەرزنجی و ژمێریارەکەی عەلی کەمال باپیر ئاغا بووە، دوای دەرچوونی ژمارە دووی ساڵی چوارەمی لە ١٥ی ئابی ١٩٦١ دا گۆڤارەکە بۆ سلێمانی گواستراوەتەوەو ناوەکەشی بۆتە (بەیان) و ئۆرگانی ئاشتیخوازانی سلێمانی بووە[١٣] لە بواری نووسیندا کۆمەڵێ ئەدیبی دیار نووسینیان تیایە بڵاوکردۆتەوە وەك: حەمید عوسمان، عوسمان مستەفا خۆشناو، گۆران، ئیبراهیم ئەحمەد، مارف بەرزنجی، محەمەدی مەلا کەریم و عەبدولسەمەد خانەقا، ئەمەو گۆڤارەکە ئەو ماوەیەی لە سلێمانی بوو_گۆران_ی شاعیر سەرپەرشتی کردووە، شایانی باسە جارێکی تر گواسترایەوە بۆ کەرکوك و ناوەکەشی بۆوە شەفەق، سەرەتای ساڵی ١٩٦٣ بەیەکجاری داخرا.[١٤]

٣- ڕۆژنامەی ئازادی: ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانەی سیاسی بووە، ئۆرگانی حزبی شیوعی عێراق_ لقی کوردستان بووە، یەکەم ژمارەی لە یەکی مایسی ١٩٥٩ دەرچووە، لە هەمان ساڵدا و لە مانگی ئابدا بۆ بەغدا گوازراوەتەوە، (١٥٦) ژمارەی لێ دەرچووەو لە ١٩٦١/٨/٦ دوای ئیلغا کردنەوەی ئیمتیازەکەی وەستا.[١٥]

---

[١٣] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤٧.

[١٤] ئەحمەد، کەمال مەزهەر (دکتۆر)، تێگەیشتنی ڕاستی و شوێنی لەرۆژنامەنووسی کوردیدا، ل٢٤٢.

[١٥] تاریخ الصحافة الکردیة، ل٥٦.

جەمال خەزنەدار سەبارەت بەم ڕۆژنامەیە دەڵێت:( ئەوەی ئێمە ئاگاداریمان لێی هەیە ئەوەیە ئەحمەد غەفوور و محەمەد کەریم فەتحوڵڵاو محەمەد مەلا کەریم و عەزیز محەمەدو حسێن عارف وعیزەدین مستەفا ڕەسول بەشداری‌یان لە دەرکردنی کردووە)[١٦].

٤- ڕۆژنامەی ڕای گەل: ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانەی سیاسی بووە، بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی دەرچووە و ئۆرگانی نیشتمانپەروەرە دیموکراسیخوازە پێشکەوتنخوازەکان بووە، خاوەن ئیمتیازو سەرنووسەرەکەی سدیق بلوکینی بووە، یەکەم ژمارەی لە ٦ی ئەیلولی ١٩٥٩ دەرچووە، لەنێوان دوو ساڵدا (٧٢) ژمارەی لێ دەرچووە، دوا ژمارەی لە ١٥ی ئەیلولی ١٩٦١ بڵاوبۆتەوە[١٧].

٥- گۆڤاری پێشرەو: گۆڤارێکی خوێندکاران بووە، لەلایەن یەکێتی گشتی خوێندکارانی عێراق_ لقی کەرکوک دەرچووە، تەنیا سێ ژمارەی لێ بڵاوبۆتەوەو یەکەم ژمارەشی لە ساڵی ١٩٦٠ دەرچووە، بە کوردی و عەرەبی و تورکی دەرچووە[١٨].

٦- گۆڤاری باباگوڕگوڕ: لەلایەن یەکێتی قوتابیانی کوردستان لقی کەرکوک لە ساڵی ١٩٧٣ دەرچووە[١٩].

٧- گۆڤاری باوە گوڕگوڕ: یەکێتی خوێندکارانی کوردستان_ لقی کەرکوک لە ساڵی ١٩٨٢ دەریکردووە و زیاتر گرنگی داوە بە خەباتی

---

[١٦] خەزنەدار، جەمال، رابەری ڕۆژنامەگەری کوردی، ل٦٨.

[١٧] تاريخ الصحافة الكردية، ل٥٨.

[١٨] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٦١.

[١٩] تێگەیشتنی ڕاستی، ل٢٥٩.

خوێندکاران و بە نهێنی چاپکراوە و بڵاوبۆتەوە. ئەوەی من تەنیا (سێ) ژمارەم بینیوە[20].

٨- گۆڤاری گزنگ: بریتی‌یە لە کۆمەڵێ بابەتی هەمەجۆر، لەلایەن دەستەیەك لە ئەدیبانی کەرکوك و لەژێر چاودێری ڕەزاشوان چاپ و بڵاوکراوەتەوە، لە شاردا تەنیا یەك ژمارەی لێ بڵاو بۆتەوە، ئەوەی ئێمەش لێی دەدوێین ئەم گۆڤارەیە..! شایانی باسە یەکەم ژمارەی لە ساڵی ١٩٧٢ لە چاپخانەی(الشمال) چاپکراوە.

٩- گۆڤاری نێرگز: دەستەیەك لە قەڵەمە دیارەکانی ئەوسای کەرکوك لە کانونی یەکەمی ١٩٨٤ چەپکی یەکەم دەرچووە و نەوێراون بە ئاشکرا ناوی بنێن گۆڤار، دووژمارەیەی لێ دەرچووە بەڵکو هەردوو ژمارەی ناولێنراوە چەپکی یەکەم و چەپکی دووەم، چەپکی دووەمیش ساڵی ١٩٨٥ دەرچووە.

---

[20] ئەرشیفی تایبەتی خۆم.

## گۆڤاری گزنگ لە نێوان سێ قۆناغدا

وەکو لە بەشی یەکەمی ئەم باسەدا ئاماژەم پێدا کە لەشاری کەرکوکدا گۆڤارێك هەبووە بە ناوی(گزنگ)[1]و لە ساڵی(١٩٧٢) چاپ و بڵاوکراوەتەوە لەو ماوەیەدا تەنیا توانرا ئەو ژمارەیە دەربچێت و لە کارکەوت، ئیتر دوای(١٠) ساڵ ئینجا دەست بەکارو چالاکی‌یەکانی کرایەوە ئەویش لەنێو ڕەحمی شۆڕشی نوێ‌ی‌گەلەکەماندا چاوی هەڵهێنا، بۆیە واباشترە گۆڤارەکە بەسەر سێ قۆناغی مێژوویدا دابەش بکەین

---

[1] بێجگە لەم "گزنگ"ە، دوو گۆڤاری تریش هەڵگری ناوی "گزنگ"ن.

ا- گۆڤاری گزنگ: لەلایەن لیژنەی قوتابیانی دواناوەندی ئێوارانی سلێمانی دەرچووە و گۆڤارێکی وێژەیی‌و خوێندەواری و کۆمەڵایەتی قوتابیان بووە، ژمارەی یەکەمی لەساڵی ١٩٥٩ بڵاوبۆتەوە.

ب- گۆڤاری گزنگ: لەلایەن لیژنەیەك لەمامۆستایانی قوتابخانەی (مەنار)ی کوڕانەوە لەسلێمانی دەرچووە، زیاتر گرنگی بەکاروباری خوێندکاران‌و ئەدەب داوە، بەزمانی کوردی‌و عەرەبی بابەتی بڵاوکردۆتەوە، یەکەم ژمارەی لە ١٩٦٧/٥/٥دا بڵاوبۆتەوە.

ج- گزنگ: گۆڤاری ئەدەبی‌و ڕۆشنبیری ئیسلامی بووە، یەکەم ژمارەی لەکۆتاییەکانی ساڵی ١٩٧٢ دەرچووە، شوێنی دەرچوونی دیارنیە.

د- گزینگ: ئەم ناوەش نزیکە لەگزنگ، گۆڤارێکە لەئەوروپا چاپ و بڵاودەکرێتەوە ژمارە (٢٠)ی ساڵی ١٩٩٧ی بینراوە.

## ٢-١ قۆناغی یەکەم -

### قۆناغی ئاشکرای گۆڤارەکە

ئێمە بڵێین و نەڵێین دوای جاڕی بەیانی(١١)ی ئازاری(١٩٧٠) کورد بە گشتی کەوتە قۆناغێکی ترەوە لە چوار ساڵی گفتوگۆکانی نێوان شۆڕش و حکومەتی مەرکەزیدا توانرا ئەو ماوەیە چەندان کارو چالاکی ئەنجام بدرێت کە زۆربەیان لە ئەنجامدا بەباش بۆ مێژووی کورد گەڕاونەتەوە. لەو چوار ساڵەدا، کە کورد سوکە دەسەڵاتێکی لە کوردستاندا هەبوو، توانرا یەك ژمارە لەگۆڤاری ((گزنگ)) دەربکرێت، راستە لە وتەی ئەم ژمارەیەدا نووسەرانی کەرکوك کۆمەڵێ پەیمانیان داوە، کە ئومێدیان وابووە ژمارەی تریشی لێدەربکەن، بەڵام بەداخەوە، دیارە ئەم چالاکیەش وەکو چالاکیە کوردییەکانی تر لەم شارەدا نە توانراوە پەیامی خۆی بباتە سەر، دیارە هۆیەکەشی چی بووە. لەو وتەیەدا هاتووە و شەرحێکی حاڵی ئەم گۆڤارەمان بۆ دەکات(( ئەم کۆمەڵە بەرهەمە کە لەباوەشی گزنگ دایە کۆکراوەتەوەو خراوەتە پێش چاوی خوێنەرانی کورد لە هەموو سوچێکی کوردستانا باکورەی کاری وێژەیی نووسەرانی کوردە لە کەرکوك، بە زۆریش بەشدارەکانی ئەندامن لە یەکێتی نووسەرانی کورد لەگەڵ ئەمەش هەموو ئەم بیرو باوەڕو تێبینیانەی کەلەنووسین و هۆنراوەو چیرۆکەکاندا دەرئەکەوێ

خاوەنەکانیان لێی بەرپرسیارن.. [٢] زۆربەی بابەتەکانی[٣] ئەم ژمارەیە بریتین لە دەقی شیعری و چیرۆك لە زۆر سەرچاوەدا واهاتووە، کە ئەم گۆڤارە لەلایەن لقی کەرکوکی یەکێتی نووسەرانی کورد- ەوە چاپ و بلاو کراوەتەوە، بەلام لە هیچ شوێنێکی ئەم ژمارەیەدا بە ڕاشکاوانە ئەمە نەنووسراوە، ڕاستە ئەم گۆڤارە لقی کەرکوك دەریکردووە، بەلام بەگوێرەی زۆر پێشبینی سانسۆری دەسەلاتی بەعس نەیهێشتووە ناوی لقی کەرکوکی بەسەرەوە بێت، هەربۆیە لەسەری نووسراوە لە ئامادەکردنی(رضاشوان).

چۆن باسی ئەم گۆڤارەکراوە

لەم دێڕانەی دادێ، چەند سەرچاوەیەك دێنینەوە، کە چۆن لەم گۆڤارە دواون، بە تایبەت لەو شێوە بیبلیۆگرافیایانەی کە لەسەر ڕۆژنامەگەری کوردی کراون.

١- ڕابەری ڕۆژنامەگەری کوردی:[٤]

گزنگ: گۆڤارێکی ئەدەبی‌یە لەلایەن یەکێتی نووسەرانی کوردلقی کەرکوك دەردەچێ لە ژێر چاودێری ڕەزاشوان: ژمارە یەکی لەمانگی نیسانی ١٩٧٢ دەرچووە.

٢- تاريخ الصحافة الكردية في العراق:[٥]

---

[٢] گزنگ (گۆڤار) ژمارە (١)، کۆمەڵە بەرهەمێکی هەمە ڕەنگەی نووسەرانی کەرکوکە، کەرکوك، ١٩٧٢، ل٣.

[٣] لەبەشێکی سەربەخۆی ئەم لێکۆڵینەوەدا، ناوی بابەتەکان بەشێوەی بیبلیۆگرافیا دەنووسینەوە.

[٤] خەزنەدار، جەمال، ڕابەری ڕۆژنامەگەری کوردی، ١٩٧٣، ل١٢٥.

**مجلەگزنگ(البزوغ) مجموعة انتاج منوعة اصدرها اتحاد ادباء الاكراد- فرع كركوك باللغه الكردية بشكل المجلة، حيث صدر العدد الاول منها فی ٥-٣-١٩٧٢ وساهم فی تحريرها ادباء وكتاب مدينه الذهب الاسودوطبعت فی مطبعة(الشمال)**

**٣- ((تێگەیشتنی ڕاستی)):[٦]**

**((گزنگ)) کەرکوك، ژمارە یەکی نیسانی ١٩٧٢ ، یەکیەتی نووسەرانی کورد لقی کەرکوك دەری دەکرد.**

**٤- کاروانی ڕۆژنامەگەری کوردی:[٧]**

**گۆڤاری گزنگ: گۆڤارێکی ئەدەبی‌یە، یەکێتی نووسەرانی کورد_ لقی کەرکوك بڵاوی دەکردەوە. تەنیا یەك ژمارەی لێ دەرچوە ئەویش لە مانگی نیسانی ساڵی ١٩٧٢ ئیتر ڕاوەستا بە هۆی ئەو بارە نالەبارەی بەسەر شاری کەرکوکدا تێپەڕی بەتایبەتی بەربەرەکانی کوردی ناو کەرکوك لەلایەن کار بەدەستانی حکومەتەوە.**

**٥- هاواری کەرکوك _ژمارە(٣)[٨]**

**گۆڤاری گزنگ: لەلایەن کۆمەڵێك لە ئەدیب و نووسەرانی شاری کەرکوك دەردەچوو، یەکەمین ژمارەی لە ١٩٧٢/٢/١٥ بڵاوکرایەوە.**

---

(٥) الجباری، جبار محمود، تاريخ الصحافة الكردية فی العراق، بغداد، ١٩٧٥، ص٧٧.

(٦) ئەحمەد، کەمال مەزهەر (دکتۆر) تێگەیشتنی ڕاستی و شوێنی لەڕۆژنامە نووسی کوردی‌دا، بەغدا، ١٩٧٨، ل٢٥٦.

(٧) جاف، وریا، کاروانی ڕۆژنامەگەری کوردی، هەولێر، ١٩٩٨، ل٨٦.

(٨) هاواری کەرکوك (گۆڤار) ژمارە (٢) هەولێر کانوونی یەکەمی ١٩٩٨، ل٤٤.

وەکو لە پێشەوە وتم سەرچاوەی تریش هەن کە لەسەر ئەم ژمارەیەی گزنگ_ یان نووسیوە. ئێمە تەنیا وەکو نموونە تەنیا لەبەر ئەم چەند سەرچاوەیەدا هەڵوەستەمان کرد، ئەوەی کە پێویستە لەم پێنج سەرچاوەیەدا پرسیار بکرێت، ڕۆژی دەرچوونی گۆڤارەکەیە، کە لە هیچ شوێنێکی نەهاتووە، کەلە فلان ڕۆژدا دەرچووەو بڵاوکراوەتەوە، لە چ شوێنێکیشی نەنووسراوە، کە لقی کەرکوکی یەکێتی نووسەرانی کورد دەریکردبێت

٦- بیلۆگرافیای ڕۆژنامەگەری کوردی[٩]

گزنگ: گۆڤاری یەکێتی نووسەرانی کورد لقی کەرکوك بوو، یەکەم ژمارەی لە نیسانی ١٩٧٢ دەرچووە، پاش دەساڵ وەستان، ژمارە(٢)ی لە شاخ و ساڵی ١٩٨٢ دەرچووە، ژمار(١٧)ی لە کانونی یەکەمی ١٩٩١ بە(١٢٠) لاپەڕە دەرچووە.

### -٢ قۆناغی دووەم

## قۆناغی نهێنی گۆڤارەکە

کاروانی گۆڤاری گزنگ دوای دەساڵ وەستان یەکەم دەستی بەدەرکردن کردەوە، بەڵام ئەمجارە چووە قۆناغی نهێنییەوەو لە نێو

---

[٩] تەنیا، ئیسماعیل، بیبلیۆگرافای ڕۆژنامەگەریی کوردی (١٩٧٥ - ١٩٩٣) هەولێر، ١٩٩٨، ل٢٢.

سەنگەری پێشمەرگەی شۆڕشی نوێی گەلەکەماندا چاوی هەڵهێناوە، زۆر جار ئەویش وەك پێشـمەرگە چۆتـە جەولـەو کەوتۆتـە کـەمینی دوژمنانـەوە و گـەلێك جاریش ڕژێـم قەسـفی کـردووە، بـەڵام ئـەمجارە هـەڵگری پەیامی یەکێتی نووسـەرانی کوردسـتان -لقی کـەرکوك بـووە، واتە بە ئاشکرا نووسراوە گۆڤاری ئەو یەکێتییەیە. نەك وەك ژمارەی یەکـەمی تـەنیا نووسـرابێت. کۆمـەڵێ نووسـەری کـورد لـە کـەرکوك دەریدەکەن.

پێشەکی پێویستە بپرسین بۆ یەکێتی نووسەرانی کوردستان نەك یەکێتی نووسـەرانیکورد؟ بەپێی بڕیـاری ٤٨٤ ی ڕۆژی ١٩٦٩/١٠/٩ وەك بڕیـاری مـافی ڕۆشـنبیری بـۆ گـەلی کـورد، ڕێگـادرا یـەکێتی نووسەرانی کورد پێك بێت، کە دەقی بڕیارەکە دەڵێت(نووسەرانی کورد مافی ڕەوای خۆیانە کـە یەکێتیـەك بۆ خۆیان ڕێك بخەن) ئیتر بۆ ئـەم مەبەستە چەند نووسەرێکی کورد داوایەکیان پێشکەش کردو وەزارەتی نـاوخۆش بـە گوێـرەی نووسـراوی ژمـارە٤٠٥ی ڕۆژی ١٩٧٠/٢/٩ ڕەزامەندی لەسەر داوەکەدەربڕی بەمجۆرە یەکێتی نووسـەرانی کـورد دامـەزرا_ ئـەو یەکێتیـیـە بەهـەر شـێوەیەك بێـت توانـی مقاوەمـەتی دەسەڵاتی بەعس بکات و پەیامی خۆی بگەیەنێت تا ڕۆژی ١٩٨٣/٨/٩ بە گوێرەی نوسراوی ژمارە ١٧٩٨ بەعس داوای دەکات کە(نقل کافە موجوداتکـم والتزامـاتکم الی الاتحـاد المزکـور) ئـەو هەڵوەشـانەوەیەی یـەکێتی نووسـەرانی کـورد چـەند سـاڵێك بـوو گـیرۆدەی ببـوو، بـەڵام مقاومـەتی نووسـەرانی کـورد هـەر بـەردەوام بـوو تالـەژێر فشـاردا بارەگاکانیان پێ داخستن تابیەنە بەشێك لە

یەکێتیئەدیبان و نووسەرانی عێراق،لەسەر ئەم ئەساسە لەنێو سەنگەری پتەوی شۆڕش نوێی گەلەکەماندا نووسەرانی پێشمەرگە لە٥/١٢/١٩٨٠ لیژنەیەکی ئامادەکردنیان پێك هێناو جاڕی یەکێتی نووسەرانی کوردستان_[١٠]یان دا. ئەوەبوو بۆ زیاتر گەیاندنی دەنگیان بە پێشمەرگەو شارەکان بڕیاریان دا، گۆڤارێکی مەرکەزی دەربکەن بەناوی(نووسەری کوردستان) لقەکانیش گۆڤار بۆ خۆیان دەربکەن. ئەوەبوو لقی کەرکوك_ گۆڤاری(گزنگ)[١١] یان دەرکرد لەم کاروانەدا، گۆڤارەکە چۆتە قۆناغێکی ترەوە ئەویش قۆناغی نهێنییە. کەتیایە(١٤) ژمارەی لێ چاپ و بڵاوبۆتەوە. ئەمەو بێجگە لە سێ پاشکۆ، بەناوی(گزنگی بچووکان)و پاشکۆیەکیش بەناوی(شانۆ)، دەستەی نووسەرانیگۆڤارەکە وەکو وەفایەك بۆ ژمارەکەی ساڵی(١٩٧٢) لە شاخ لە ژمارە(دوو)ەوە دەستیان پێکردۆتەوەو خۆیان بەدرێژە پێدەری ئەو گۆڤارە زانیوەو ئەوتاقە ژمارەیەیان لەبیر نەکردووە، یەکەم ژمارەی ئەم قۆناغەی گزنگ کەدەکاتە دووەم ژمارە لە ساڵی ١٩٨٣ چاپ وبڵاوکراوەتەوە و تا ساڵی ١٩٨٩ بەردەوام بووەو ژمارەکانی بەگشتی گەیشتۆتە ژمارە(١٥).

---

[١٠] بۆزیاتر شارەزابوون لەسەر ئەم بابەتە بنۆڕە ئەم کتێبە
- ئەحمەد، نەوزاد عەلی، یەکێتی نووسەرانی کورد یان یەکێتی نووسەرانی کوردستان، شەقڵاوە، ١٩٩١(کاتی خۆی بەناوی -گردوان- بڵاوم کردۆتەوە).
[١١] لقی هەولێریش گۆڤاری "نووسەری نوێ" یان دەردەکرد بەداخەوە تەنیایەك ژمارەی لێ چاپ و بڵاوکرایەوە.

## ٢-٣ قۆناغی سێیەم

## گزنگ_ی دوای ڕاپەڕین

ڕاپەڕینی گەلەکەمان لە بەهاری ١٩٩١ گەلێك گوتاری تازەی هێنایە ئاراوەو گەلێك کێشەو مەسەلەی خستە دیوێکی ترو دەسەلاتی گواستەوە بۆ کورد، ئیتر لەسەر ئەم بنەمایە پانتاییەکی‌تر بۆ باری ڕۆژنامەگەری کوردی چێ‌بوو، گۆڤاری"گزنگ"یش چووە قۆناغێکی ترەوەو دووژمارەی تری خستە سەر خەرمانەی ژمارەکانی تری کەهەڵگری ژمارە(١٦)و (١٧) بوون. لەپێشەکی ژمارە(١٦)دا بەناوی وتەی ژمارە لە پەرەگرافێکدا هاتووە:(ڕۆژگار تێ‌پەڕین و گزنگ هات ژمارەیەك و دوو زیادیان کرد و ژمارەیان بوو بە((١٥)) هەر بەوەشەوە نەوەستاو سێ ژمارەی ((گزنگی بچووکان))و ژمارەیەکی تایبەت بە شانۆ دەرچوون و هەر ژمارەیەك لەم ژمارانە بۆ خۆی داستانی کاروانی خەباتی گزنگی هاوشانی خەباتی گەل دەگێڕنەوە... ل٥ ) لەسەر ڕووبەرگی ژمارە (١٦)دا نووسراوە (گزنگ: گۆڤاری یەکێتی نووسەرانی کوردستان لقی کەرکوك و لە ئەیلولی ١٩٩١ چاپ وبلاو بۆتەوە.) بەلام لەسەر ڕووبەرگی ژمارە (١٧) دا نووسراوە (گزنگ گۆڤاری یەکێتی نووسەرانی کورد_ لقی کەرکوك_ە) کە ئەم ژمارەیە لە کانونی یەکەمی ١٩٩١ چاپ وبلاو بۆتەوە، ڕاستە دوای ڕاپەڕین نووسەرانی کورد هەموویان لە ژێر ئالای یەکێتی نووسەرانی کوردستان کاریان دەکردو هەر ڕۆژانی ڕاپەڕیندا، لەژێر چاودێری دەستەی بەڕێوە بەری ئەو یەکێتیەدا، هەرشارەو کۆبوونەوەی خۆی کرد و دەستەیەکی بەڕێوەبەری کاتی بۆلقەکانیان هەڵبژارد، یاخود دەست نیشان کرد تاخۆیان بۆکۆنگرەی گشتی ئامادەبکەن، ئیتر بۆژمارە(١٦)لەسەری نووسراوە یەکێتی نووسەرانی کوردستان؟ ژمارە(١٧) یش لەسەری نووسراوە یەکێتی نووسەرانی کورد؟ کەلە نێوان ئەودوو ژمارەیەدا کۆنگرەی نووسەران بەناوی کۆنگرەی ڕاپەڕین لەمانگی تشرینی

یەکەمی ١٩٩١ لە شارۆچکەی شەقڵاوە بەستراو ناوی یەکێتی نووسەران کراوە بە یەکێتی نووسەرانی کورد.

لەکۆتاییدا پێویستە ئەوە بڵێین کە "گزنگ" لە (١٩٧٢)تا ١٩٩١(١٧) ژمارەی لێ بڵاوبۆتەوە لەدوای ژمارە(١٧)ەش هیچ دەنگ و سەدایەك نیە کە بەردەوام بوونی بسەلمێنێ.

## بیبلیۆگرافیای گۆڤارەکە

### چەند زانیاریەکی تر.

بێجگە لەو زانیاریانەی لەمەڕ گۆڤاری گرنگ خستمانە روو، پێش چوونە نێو بیبلیۆگرافیای بابەتەکان و بیبلیۆگرافیای ناوەکان، چەند زانیاریەکی تریش دەخەینە روو، تاببنە پاڵپشتێکی تر بۆ لێکۆڵینەوەکەو باشتر گۆڤارەکە رۆشنتر ببێت.

- هێشتا کاتی یاسایی و وەکو عادەتێکیش بە بەری وەماوە ناوە نهێنیەکانی نووسەرانی دوو توێی گۆڤارەکە ئاشکرا بکەین، ئەگەر نا ئاشکراکردنی ناوەکان ئاسانە.
- ئەو بەرێزانەی زیاتر ئەو سەرەوەرییە مەزنەیان بۆ گۆڤارەکە تۆمارکرد بەرێزان (حەمەکەریم عارف، محمد موکری، ئەحمەد عارف)ن کەبێ ئەندازە خەمخۆری تەمەنی گۆڤارەکەن، بەتایبەتی لەزەمەنی شاخدا، واتە لە ژمارە (٢ تا ١٥) هەروەها لە دووژمارەکەی دوای راپەرینیشدا رۆڵیان بەرچاوە، بەلام ژمارە (یەك) لەژێر چاودێری بەرێز رەزا شوان دابووە.

- تەنیا ژمارە یەك بەکاغەزی بۆری رۆژنامە چاپکراوە بەڵام ژمارەکانی تر هەموویان کاغەزەکەیان سپی‌یەو ئینجا یان ٨٠ غم یاخود ٧٠ غم.
- وەکو چاپ و چاپخانەو یارمەتیدان، یەکێتی‌ی نیشتمانی‌ی کوردستان بۆ ئەندازە یارمەتی گۆڤارەکەی داوە، بەڵام نابێت رۆڵی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و حزبی سۆسیالیستی کوردستان- یش لەبیر بکرێ، کەلە رووی مەوادی چاپەوە بەگوێرەی توانا درێخیان نەکردووە.
- تەنیا بەرگی ژمارەیەك دوورەنگە، بەڵام ژمارەکانی تر تەنیا یەك رەنگ بەکارهاتووە.
- کارە هونەرییەکان زۆربەیان هونەرمەند رەمزی قوتبەدین کاری تیایا کردووە، بەتایبەتی هێڵکاری و مۆنتیڤەکانی ناوەوە، خەتەکانیش هەندێك جار خۆشنووسی جوانەمەرگ بەکر حسێن نووسیویەتی.
- بەرگ، زۆربەیان هونەرمەند رەمزی قوتبەدین یاخود هونەرمەندشوان کێشاویەتی.
- لە تایپکردنی بابەتەکاندا زیاتر تایپی ئاسایی و تایپی بی ئێم و برازەر بەکارهاتووە.
- لەبەر مامەڵەی دیکتاتۆرییانەو نادیموکراسیانەی دەسەڵاتی بەغدا، زۆربەی بابەتەکان بەئیمزای ناوی نهێنی بڵاوکراونەتەوە بەتایبەتی ئەوانەی لەشارەکان بابەتیان بۆ دەنارد.

## کورتەیەك سەبارەت بە گۆڤارەکە

- ژمــاره یــەك، ١٩٧٢، ٨٠ لاپــەڕە، ١٥ x ٢١ ســم لەچاپخانەی شیمال - کەرکوك چاپکراوە.

- ژمارەدوو، ئاداری ١٩٨٣، (١٠٤) لاپەڕە، ١٦,٥ x ٢١ سم لەیەکێك لە چاپخانەکانی یـەکێتی‌ی نیشـتمانی‌ی کوردسـتان چاپکراوە.

- ژمـاره سـێ، ئـابی ١٩٨٣، (٩٢) لاپــەڕە، ١٦,٥ x ٢١ سم لەیەکێك لـە چاپخانـەکانی یـەکێتی‌ی نیشـتمانی‌ی کوردسـتان چاپکراوە.

- ژمارە چـوار، ئایـاری ١٩٨٤، (١٠٤) لاپـەڕە، ١٦,٥ x ٢١ سم لەیەکێك لە چاپخانەکانی یەکێتی‌ی نیشتمانی‌ی کوردستان چاپکراوە.

- ژمارە پێنج، حوزەیرانی ١٩٨٤، (١٠٦) لاپەڕە، ١٦,٥ x ٢١ ســم لەیــەکێك لەچاپخانــەکانی یــەکێتی‌ی نیشــتمانی‌ی کوردستان چاپکراوە.

- ژمارە شەش، کانوونی یەکەمی ١٩٨٤، (١٠٤) لاپەڕە، ١٦,٥ x ٢١ سم، لەچاپخانــەی شــەهید ئیــبراهیم عــەزۆ - ی.ن.ك چاپکراوە.

- ژمارە حەوت، کانوونی دووەمی ١٩٨٥، (١٠٤) لاپەڕە، ١٦,٥ x ٢١ سم، لەچاپخانەی شەهید ئیبراهیم عەزۆ- ی.ن.ك چاپکراوە.
- ژمارە هەشت، دەستمان نەکەوت.
- ژمارە نۆ، ئاداری ١٩٨٥ (٩٢) لاپەڕە، ١٦,٥ x ٢١ سم، لەچاپخانەی شەهید ئیبراهیم عەزۆ- ی.ن.ك چاپکراوە.
- ژمارە دە، مایسی ١٩٨٥ (١٠٠) لاپەڕە، ١٦,٥ x ٢١ سم، لەچاپخانەی شەهید ئیبراهیم عەزۆ- ی.ن.ك چاپکراوە.
- ژمارە یانزدە، حوزەیرانی ١٩٨٥، (١٠٠) لاپەڕە، ١٦,٥ x ٢١ سم، لەچاپخانەی شەهید عبدالخالق معروف- ی.ن.ك چاپکراوە.
- ژمارە سیانزدە، دەستمان نەکەوت.
- ژمارە چواردە، کانوونییەکەمی ١٩٨٥، (١٠٨) لاپەڕە، ١٦,٥ x ٢١ سم، لە چاپخانەی شەهید عبدالخالق معروف- ی.ن.ك چاپکراوە.
- ژمارە پانزدە، نیسانی ١٩٨٩، (١٠٠) لاپەڕە، لەچاپخانەی شەهید عبدالخالق معروف- ی.ن.ك چاپکراوە.
- ژمارە شانزدە، ئەیلولی ١٩٩١، (١١٢) لاپەڕە، ١٧ x ٢١سم، ناوی چاپخانەی بەسەرەوەنیە.
- ژمارە حەڤدە، کانوونی یەکەمی ١٩٩١، (١٢٠) لاپەڕە ١٧ x ٢٠ سم، ناوی چاپخانەی بەسەرەوەنیە.

## کورتکراوەی چەند وشەو زاراوەیەك

س: ساڵ

ژ: ژمارە

ئا: ئامادەکردن

و: وەرگێڕان

ل: لاپەڕە

سم: سەنتیمەتر

# بیبلیۆگرافیای بابەتەکان

## شیعری کوردی

-ا-

١- ئاوابوون، کەریم دەشتی، ژ-١٧، ١٩٩١، ل٨٣ - ٨٤.

-ب-

٢- باخی ئەستێرە سوورەکانیان بەخوێنی گەشیان ئاودا، شەهاب عثمان، ژ-٢، ١٩٨٣ ل ٤٨--٥٠.

٣- بەرزبوونەوە، بەکر پشدەری، ژ- ١٦، ١٩٩١ ل ١٠٦-١٠٧.

٤- بروسکە، پۆلا، ژ-١٠، ١٩٨٥، ل٥٣-٥٤.

٥- بۆ هەڵۆکەی سەکەوتوو، سابیر، ژ-١٥، ١٩٨٩ل ٦٧ - ٧١.

٦- بیروڕا، شێرکۆ بێکەس، ژ- ١٧، ١٩٩١ ل ٨٢.

-پ-

٧- پاشەرۆژ، دلاوەر مەحمود، ژ-١٢، ١٩٨٥ ل٦١.

٨- پرس، نجیبە ئەحمەد، ژ-٦، ١٩٨٤، ل٩١.

٩- پۆیلانە، سەلام، ژ-١٢، ١٩٨٥ ل٦٢-٦٣.

١٠- پێنج ئەستێرە، سەعدوڵلا پەرۆش، ژ-٣، ١٩٨٣ ل٦٥-٦٨.

